## پێشەكی ( وەرگێر )

الحمدلله و الصلاة و السلام على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أما بعد :

خوێنەری ئازیز هیچ كەسێك لە ئێمە لەم تاوانانەی كە لەم نامیلكەدا هاتووە بێ بەش نین ئەگەر لە هەندێكی بەدوور بین بە هەندێكی تێگلاوین ، و تاكە ڕێگەیەك بۆ قوتار بوون لەم تاوانانە و هەڵنەگرتنیان بۆ ناو گۆڕ و قیامەت ئەویش بریتییە لە خۆ ڕاهێنان بە تەوبە كردن لە دوای دووبارە بوونەوەی تاوانەكە و ئەگەر تاوانەكەش حەقی كەسێكی زەوت كردبێ لەگەڵ تەوبەكەدا ئەو حەقەش بگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنی و سەد لە سەد دڵنیابە لەوەی شەیتان ئەیەوێ تۆ بێ ئومێد بیت لە ڕەحمی خودا ئەوكاتە ئاواتەكەی دێتە دی و خوداش ئەیەوێت تۆ بێ ئومێد نەبی لە لێخۆش بوونی خودا وەكو دەفەرموێت ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾[1] واتە : ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەو بەندانەم بڵێ كە زیادەڕەوییان كردووە لە تاوان كردن دەرحەق نەفسی خۆیان ، پێیا بڵێ : لە ڕەحم و میهرەبانی خودا بێ ئومید مەبن ، و دڵنیابن لەوەی خوای گەورە لە هەموو تاوانەكان خۆش دەبێت ، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە لێبوردەیە و بە ڕەحمە

---

١ - الزمر آية ٥٣ .

**وهەروەها دەفەرموێت** ﴿ لَا تَيْأَسُــوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ ﴾[٢] **واتە: هەرگیز بێ ئومێد مەبن لە سۆز و ڕەحمی خودا ، و بزانن تەنها ئەوانە بێ ئومێد دەبن لە ڕەحمی خودا کە بێ باوڕن و خودا بە حەق ناناسن .**

**ئازیزان کە هەوڵماندا بێ ئومێد نەبین لە ڕەحمی خودا ئەوا دەبێت ئەو ڕێگەیەش بزانین کە دەبێتە مایەی ســـڕینەوەی تاوانەکەمان هەرچـــەند گەورە بێت و چـــەند دووبارەش ببێتەوە ، بە کورتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمودەیەك بۆی باس کردووین وەك دەفەرموێت :**

( ما مِن رجلٍ يُذْنِبُ ذنبًا فيتَوضَّأُ فيُحسِنُ الوُضوءَ ثمَّ يُصلِّي رَكعَتينِ فيستغفرُ اللهَ عزَّ وجلَّ إلَّا غفرَ لهُ )[٣]

**واتە : هیچ کەسێك نییە تاوانێك بکات پاشان بە جوانی دەستنوێژێکی بۆ بگرێت و دوو رکات ســوننەت بکات و داوای لێ خۆشــبوون لە خودا بکات ئیلا خوای گەورە لێ خۆش دەبێت .**

---

٢ - يوسف آية ٨٧ .

٣ - صحيح أبي داود برقم ( ١٥٢١ ) .

**ئازیزان خوای گەورە لە ئێمەی نوقسان تەنها ئەیەوێت بە دڵمان ڕووی تێ بکەین ئیتر هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بە خۆیمان بۆ ئاسان دەکات ، داواکارم لە خوای گەورە بە تاوانەکانمان لەگەڵمان نەکات و بە گەورەیی خۆی لە کەم و کوڕیمان ببورێت و شــەرمەندەی لای خۆیمان نەکات ، تۆش خوێنەری بەڕێز هەر کەم و کوڕییەك لە نامیلکەدا بە دی دەکەیت بزانە لە شەیتان و لە نەفسی خۆمەوەیە و داوای لێبوردنی لەســەر دەکەم و ئەگەر شــایەنی باســە ئاگادارم بکرەوە ئەگەر نا لوتف بکە و بەســـەری تێپەڕە و ئەگەر چــاکەشـــت لێ بەدی کرد بزانە لە فەزڵی خودایە بەسەرمانەوە .**

براتان
محمد أحمد صالح
٣٠/ ڕەجەب/١٤٤٤
وەرگێڕ و دیزاینەر
٠٧٧٠٩٩٣١٧٣٢

پێشەکی ( نوسەر )

**تاوانە گەورەکان :** بەم شێوەیە تاوانی گەورە دەناسرێتەوە :

ئەگەر لە قورئان یان سونەت یان وتەی کۆڕای زانایان ناوی تاوانێك هات بە گەورا، یان ئەگەر تاوانێك سزایەکی بەئێشی لەسەر دانرابوو ( وەك خۆپاك ڕانەگرتن لە میز سزایەکە لە سزاکانی گۆڕ ) ، یان ئەگەر تاوانێك سنورێکی شەرعی بەزاندبوو ( وەك زینا و کوشتن ..) ، یان بکەری ئەو تاوانە نەفرەتی لێکراوە ( وەك ریباخۆر نەفرەتی لێکراوە کەواتە ریبا خواردن لە تاوانە گەورەکانە ) ، یان بکەری ئەو تاوانە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکرێت ( وەك بڕینی سیلەی ڕەحم لە فەرموودەدا هاتووە ئەوەی سیلەی ڕەحم بپچڕێنێت بەهەشتی لەسەر حەرامە کەواتە بڕینی سیلەی ڕەحم لە تاوانە گەورەکانە چونکە بەهەشت لەسەر خاوەنەکەی حەرام دەکات ) .

**فەزڵی دوورکەوتنەوە لە تاوانە گەورەکان :**

خوای گەورە دەفەرمویێت : ﴿ إِنْ تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُمْ مُدْخَلًا كَرِيمًا ﴾[٤] واتە : ئەگەر ئێوە خۆتان بە دوور بگرن لەو تاوانە گەورانەی کە ڕێگریتان لێ کراوە ئەنجامی بدەن ، ئەوا ئێمەش لە تاوانە بچوکەکانتان خۆش دەبین و دەتان خەینە جێگەیەکی بەڕێز کە ئەویش بەهەشتە .

---

٤ - النساء آية ٣١ .

**وەهەروەها دەفەرموێت :** ﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ ... ﴾[٥] **واتە : ئەوانەی خۆیان بەدوور دەگرن لە تاوانە گەورەکان و کارە پیسەکان بەڵام خاوەنی تاوانی بچوکن ئەوا ئێمەە لێیان دەبورین ، بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لێبوردەی زۆر فراوانە .**

**وەهەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :**

( الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالْجُمْعَةُ إلى الجُمْعَةِ، وَرَمَضَانُ إلى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ ما بيْنَهُنَّ إذَا اجْتَنَبَ الكَبَائِرَ ) [٦]

**واتە : پێنج نوێژەکە ، و هەینی بۆ هەینی ، و ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان ، هەموو ئەو کردەوانە دەبنە مایەی سڕینەوەی تاوانی نێوان خۆیان تەنها تاوانە گەورەکان نەبێت .**

د. صالح بن عبدالله الصياح

أستاذ مساعد في جامعة المجمعة / الرياض

جزاه الخير الجزاء وجعل جَمعه هذا ذُخراً له و لوالديه

---

٥ - النجم آية ٣١ .

٦ - رواه مسلم .

### ❖ یەکەم : هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( أَلا أُنَبِّئُكُمْ بأَكْبَرِ الكَبائِرِ قُلْنا: بَلَى يا رَسولَ اللَّهِ، قالَ: الإشْراكُ باللَّهِ ..)[٧]

**واتە : ئایە هەواڵتان بدەمی لە بارەی گەورەترینی تاوانە گەورەکان ؟ هاوەڵان** (رضي الله عنهم) **فەرموویان بەڵێ ، ئەویش فەرمووی : بریتییە لە هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە .**

### ❖ دوووەم : نوێژنەکردن :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( ليسَ بينَ العبدِ وبينَ الشِّرْكِ إلَّا ترْكُ الصَّلاةِ )[٨]

**واتە : هیچ شـــتێك نییە لە نێوان بەندە و هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە تەنها نوێژنەکردن نەبێت . ( واتە هەرکەســێك نوێژ تەرك بکات کەوتووەتە ناو هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە )** (وەرگێڕ)

---

٧ - رواه البخاري و مسلم .

٨ - رواه مسلم .

❖ **سـێیەم و چـوارەم و پێنجەم : خراپبوون لەگەڵ دایك و باوك و کوشـتن و شایەتیدانی درۆ :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( أَكْبَرُ الكَبَائِرِ: الإشْرَاكُ باللَّهِ ، وقَتْلُ النَّفْسِ، وعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ، وشَهَادَةُ الزُّورِ )[٩]

**واته : گەورەترینی تاوانە گەورەکان بریتییە لە : هاوەڵبڕیاردان ۆ خوای گەورە ، و کوشتنی نەفس ، و خراپبوون لەگەڵ دایك وباوك ، و شایەتیدانی درۆ.**

❖ **شەشەم : نەفرەت کردن لە دایك و باوك :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّ مِن أكْبَرِ الكَبائِرِ أنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ والِدَيْهِ. قيلَ: يا رَسولَ اللَّهِ ،وكيفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ والِدَيْهِ؟ قالَ: يَسُبُّ الرَّجُلُ أبا الرَّجُلِ، فَيَسُبُّ أباهُ، ويَسُبُّ أُمَّهُ )[١٠]

**واته : بەڕاستی یەکێك لە تاوانە گەورەکان بریتییە لەوەی کەسێك نەفرەت بکات لە دایك و باوکی خۆی ، هاوەڵان** (رضي الله عنهم) **فەرموویان : باشە کەسێك نەفرەت لە دایك و باوکی خۆی دەکات ؟ ئەویش فەرمووی : بریتییە لەوەی کەسێك جوین بە باوکی کەسێك بدات ، ئەویش لە بەرامبەردا جوێن و نەفرەت دەدات بە باوك و دایکی جوێندەر .**

---

٩ - رواه مسلم .

١٠ - رواه البخاري و مسلم .

**❖ حەوتەم تا پانزەیەم : حەوت تاوانە لەناوبەرەکە :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( اجْتَنِبُوا السَّــبْعَ المُوبِقاتِ قالوا: يا رَســولَ اللَّهِ وما هُنَّ؟ قالَ: الشِّــرْكُ باللَّهِ، والسِّحْرُ، وقَتْلُ النَّفْسِ الَّتي حَرَّمَ اللَّهُ إلَّا بالحَقِّ، وأَكْلُ الرِّبا، وأَكْلُ مالِ اليَتِيمِ، والتَّوَلِّي يَومَ الزَّحْفِ، وقَذْفُ المُحْصَناتِ المُؤْمِناتِ الغافِلاتِ )[١١]

**واتە : خۆتان بە دوور بگرن لە حەوت لە ناوبەرەکە ، هاوەڵان فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) **ئەو حەوتە کامانەن ؟ فەرمووی :**

**هاوەڵبڕیاردان بۆ خوای گەورە ، و جادووکردن ، و کوشــتنی نەفس کە خوای گەورە حەرامی کردووە مەگەر بەحەق نەبێت ، و خواردنی سوو ، و خواردنی ماڵی هەتیو ، و پاشــگەزبوونەوە لە جەنگ بەرامبەر کافران لە کاتی تەنگانەدا ، و بوهتان کردن بۆ ئافرەتانی مێرداری ئیمانداری بێ تاوانی بێ ئاگا .**

---

١١ - رواه البخاري ومسلم .

### دوانزەیەم : باوەڕنەهێنان بە تەواوی :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ إلَّا مُؤْمِن )[١٢]

**واتە : ئەگەر کەسێك باوەڕ بەتەواوی نەهێنێت ناڕواتە بەهەشتەوە .**

### سیانزەیەم : ئازاردانی دراوسێ :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَن لا يَأْمَنُ جارُهُ بَوائِقَهُ )[١٣]

**واتە : هەر کەسێك دراوسێیەکەی لە شەڕ و خراپەی پارێزراو نەبێت ناڕواتە بەهەشتەوە .**

### چواردەیەم : خۆبەگەورەزانین :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَن كانَ في قَلْبِهِ مِثْقالُ ذَرَّةٍ مِن كِبْرٍ )[١٤]

**واتە : هەرکەسێك بە هێندەی دەنکە گەردیلەیەك فیز و خۆبەزل زانین لە ناو دڵیدا بێت ناڕواتە بەهەشتەوە .**

---

١٢ - رواه مسلم .
١٣ - رواه مسلم .
١٤ - رواه مسلم .

### ❖ پانزەیەم : قسە هێنان و بردن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ نَمَّامٌ )[١٥]

**واتە : هەرکەسێك قسە بهێنێت و قسە ببات و فیتنە گێڕی بکات ناڕواتە بە هەشتەوە .**

### ❖ شانزەیەم : خۆکوشتن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن تَحَسَّى سُمًّا فَقتَلَ نَفْسَهُ، فَسُمُّهُ في يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ في نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا )[١٦]

**واتە : هەرکەسێك ژەهرێك دەردخواردی خۆی بکات و خۆی بکوژێت ، ئەوا لە ڕۆژی دوای ئەو ژەهرەیەی بە دەستەوەیە لە ناو ئاگری جەهەنەم بەهەتا هەتایی هەر دەیخواتەوە و سزای پێ دەدرێت .**

---

١٥ - رواه مسلم .

١٦ - رواه البخاري و مسلم .




### ❖ حەڤدەیەم : سیلەی ڕەحم پچڕاندن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ )[١٧]

**واتە : ناڕواتە بەهەشتەوە ، ئەوەی سیلەی ڕەحم بچڕێنێت .**

### ❖ هەژدەیەم : خواردنی پارەی حەرام :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يدخُلُ الجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ من سُحْتٍ ، النَّارُ أَوْلَى به )[١٨]

**واتە : هەرکەسێك بە پارەی حەرام جەستەی گەروە کردبی ناڕواتە بەهەشتەوە ، ئەو جەستەیە هەر ئاگر شایستەیەتی .**

---

١٧ - رواه مسلم .

١٨ - صحيح الترمذي رقم ٦١٤ .

**❖ نۆزدە هەتا بیست و سێ : ئەو پێنجەی نارۆنە بەهەشتەوە :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يدخلُ الجنةَ صاحبُ خمسٍ : مدمنُ خمرٍ ولا مؤمنٌ بسحرٍ ولا قاطعُ رحمٍ ولا كاهنٌ ولا منانٌ )[١٩]

**واتە : هەڵگری ئەم پێنج تاوانە نارۆنە بەهەشتەوە : ئاڵودە بووی مەی خواردنەوە ، و ئەو کەسەی باوەڕی بە جادوو هەیە ، و کەسی جادوو باز و ئەو کەسەی کە بە منەتەوە خێر دەبەخشێت .**

**❖ بیست و چوار: ئەو کەسەی قەرز بکات و نییەتی دانەوەی نەبێت:**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلَّا الدَّيْنَ )[٢٠]

**واتە : کەسی شەهید لە هەموو تاوانەکانی خۆش دەبێت ، تەنها قەرز نەبێت .**

---

١٩ - رواه أحمد و حسنه الألباني .

٢٠ - رواه مسلم .

❖ **بیست و پێنج و بیست و شەش : ئەو ئافرەتانەی خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان و ئەو پیاوانەی کە بێ دەنگن لە ئاست خراپەی خێزانەکانیان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( ثلاثٌ لا يدخلون الجنةَ ولا ينظرُ اللهُ إليهم يومَ القيامةِ : العاقُّ لوالدَيه والمرأةُ المترجلةُ المتشبهةُ بالرجالِ و الديوثُ )[٢١]

**واتە : ســـێ جۆر لە خەڵك نارۆنە بەهەشـــتەوە و خودای گەورە لە ڕۆژی دوایی تەماشایان ناكات : ئەوەی بۆ دایك و باوكی خراپە و ئەو ئافرەتەی خۆی دەكات بە پیاو و خۆی دەچـــوێنێت بە پیاوان و ئەو پیاوەی بێ دەنگە لە ئاســـت فەســـادی ماڵەوەی .**

❖ **بیست وحەوت هەتا بیست و نۆ : ئەم سێ كەسە نارۆنە بەهەشتەوە :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( ثلاثةٌ لا يَدخلُونَ الجنَّةَ، الشَّيخُ الزَّاني، والإمامُ الكذَّابُ، والعائلُ المزهُوُّ )[٢٢]

**واتە : سێ جۆر لە خەڵك نارۆنە بەهە شتەوە ، پیرە پیاوێكی زیناكار ، و فەرمان ڕەوایەكی درۆزن ، و هەژارێكی خۆبەگەورەزان .**

---

٢١ - رواه أحمد و النسائي وحسنه الألباني

٢٢ - رواه مسلم .

❖ ســــى : ڕەوشت خراپى خۆبەزلزان :

پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لا يدخُلُ الجنَّةَ ، الجوَّاظُ الجَعْظَرِيُّ )[٢٣]

**واتە : ناڕواتە بەهەشتەوە ، ئەو کەسەی ڕەوشتی خراپە وخۆبەزلزانە.**

❖ **ســى و یەك : کوشتنى کەسى بەڵێن پێ دراو لە نێو دەسەڵاتى ئیسلامى :**

پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن قَتَلَ مُعاهَدًا لَمْ يَرِحْ رائِحَةَ الجَنَّةِ، وإنَّ رِيحَها تُوجَدُ مِن مَسِيرَةِ أرْبَعِينَ عامًا)[٢٤]

**واتە : هەرکەسێك کەسێك بکوژێت کە بەڵێنى پاراستنى پێ دراوە لە لایەن دەسەڵات و دەوڵەتى ئیسلامیەوە ئەوا بۆنى بەهەشت ناکات ، و بە دڵنیاییەوە بۆنى بەهەشت چل ساڵ ڕێ دەڕوات .**

---

٢٣ - رواه أبو داود و صححه الألباني .

٢٤ - رواه البخاري ومسلم .

### ❖ سـى و دوو : فەرمان ڕەوای فێڵباز :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( ما مِن عَبْدٍ يَسْـــتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَومَ يَمُوتُ وهو غاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عليه الجَنَّةَ )[٢٥]

**واتـه : هـەر بـەنـدەیـەك خوای گـەوره فـەرمـان ڕەوایـەتییـەکی پێ ببەخشێت ، و وەفات بکات و لەو ساتەی کە وەفات دەکات فێڵی لە ژێر دەستەکەی کردبێت ئیلا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات .**

---

٢٥ - رواه البخاري ومسلم .

❖ سـی و سیٚ و سی و چوار : لیٚدان له خهڵك و سفووری ئافرهتان :

پیٚغهمبهری خوا (صلى الله عليه وسلم) دهفهرمویٚت :

( صِـنْفانِ مِن أهْلِ النَّارِ لَمْ أرَهُما، قَوْمٌ معهُمْ سِـياطٌ كَأَذْنابِ البَقَرِ يَضْـرِبُونَ بها النَّاسَ، ونِسـاءٌ كاسِـياتٌ عارِياتٌ مُمِيلاتٌ مائِلاتٌ، رُؤُوسُـهُنَّ كَأَسْـنِمَةِ البُخْتِ المائِلَةِ، لا يَدْخُلْنَ الجَنَّةَ، ولا يَجِدْنَ رِيحَها، وإنَّ رِيحَها لَيُوجَدُ مِن مَسِــيرَةِ كَذا وكَذا )[٢٦]

**واته : دوو گرووپ له خهڵك ئههلی دۆزهخن له سـهردهمی مندا نهیانم بینیوه ، کهسـانیٚك قامچییان به دهسـتهوهیه وهکو کلکی مانگا وایه به قامچییهکهیان له خهڵکی دهدهن ، و ئهو ئافرهتانهی که پۆشتهن بهڵام ڕووتن و بهلارو لهنجهوه به ڕیٚگادا دهڕۆن و دڵی پیاوان بۆ لای خۆیان دهکیٚشن ، ئهو جۆره ئافرهتانه قژیان کۆدهکهنهوه لهسهر سهریان وهکو بان پشـتی حوشــتر بهرزی دهکهنهوه نارۆنه بهههشــتهوه و بۆنیشــی ناکهن، ههر چهند بۆنی بهههشتیش ئهمهنده و ئهمهنده ڕیٚ دهڕوات .**

---

٢٦ - رواه مسلم .

**❖ سـى و پێنج : خۆنەپاراستن لە میز :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارێکیان بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی :

( إنَّهما ليُعذَّبانِ وما يُعذَّبانِ في كبيرٍ ثمَّ قال : بلى أمَّا أحدُهما فكان يسعى بالنَّميمةِ وأمَّا الآخَرُ فكان لا يستنزِهُ مِن بولِه )[٢٧]

**واتە : ئەم دوو کەسە ئێستا سزا دەدرێن و لەبەر تاوانێك سزا نادرێن کە بە لای خەڵکەوە گەورە بێت**

( واتە بەلای خەڵکەوە بچوکە بەڵام بەلای خوداوە گەورەیە) **دانەیەکیان بەهۆی قسە هێنان و بردن سزا دەدرێت و ئەوەکەی تریش بەهۆی ئەوەی خۆی لە میز نەدەپاراست .**

---

٢٧ - رواه البخاري ومسلم .

### ❖ سـى و شەش : سويند خواردن بە درۆ :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( الكَبائِرُ: الإشْراكُ باللَّهِ ، و عُقُوقُ الوالِدَيْنِ ، و اليَمِينُ الغَمُوسُ )[٢٨]

**واته : تاوانە گەورەکان بریتییە لە : هاوەڵبڕیاردان ، خراپبوون لەگەڵ دایك و باوك ، و سوێند خوارن بە درۆوە .**

### ❖ سـى و حەوت : درۆکـــردن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( آيَةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ: إذا حَدَّثَ كَذَبَ ،وإذا وعَدَ أخْلَفَ ،وإذا اؤْتُمِنَ خانَ )[٢٩]

**واته : نیشـانەی کەسـی مونافیق سـێ دانەیە : کاتێك قسـە دەکات درۆ دەکات ، کاتێك بەڵێن دەدات نایباتە سـەر ، و کاتێك ئەمانەتێکی پێ ڕادەسپێری خیانەتی لێ دەکات.**

---

٢٨ - رواه البخاري .

٢٩ - رواه مسلم .

## ❖ سـی و هەشت : زیناکردن :

خوای پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء ٣٢)

**واتە : نزیکی کاری داوێن پیسی مەبنەوە چونکە بەڕاستی زینا و داوێن پیسی تاوان و کردەوەیەکی خراپ و ڕێگایەکی ناپەسەندە .**

## ❖ سـی و نـۆ : نیربازی :

خوای پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ﴾[٣٠]

**واتە : ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) باســی پێغەمبەر لوت (عليه السلام) بۆ ئومەتەکەت بکە ، کاتێك بە گەلەکەی فەرموو ئایە ئێوە کاری شورەیی و فاحیشـــەی وا دەکەن کە بەر لە ئێوە هیچ کەســـێك لە جیهاندا نەیکردووە ؟! .**

---

٣٠- الأعراف آية ٨٠ .

## ❖ چـــل : سووخواردن :

عبدالله كوڕی مسعود (رضي‌الله‌عنه) فەرموویەتی :

( لَعَنَ رسـولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) آكِلَ الرِّبا ، ومُوكِلَه ، وشـاهدَه وكاتبَه وقال هُم سَواء )[٣١]

**واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی كردووە لە ریبا خۆر و نەفرەتی كردووە لەوەش كە وەكالەتی بۆ دەكات و نەفرەتی كردووە لەوەی دەبێتە شـــایەت لە بۆیان و نەفرەتی كردووە لەوەش گرێبەســـتەكەیان بۆ دەنوســـێت وفەرمویەتی هەموویان وەك یەك تاوانیان دەگاتێ .**

## ❖ چـــل و یەك : زەكات نەدان :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ( ما مِن رجلٍ لا يُؤدِّي زكاةَ مالِه إلَّا جاء يومَ القيامةِ شُـــجاعًا من نارٍ ، فيُكْوَى بِها جبهتُه وجنبُه و ظهرُه في يَوْمٍ كانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ، حتَّى يُقضَى بينَ النَّاسِ )[٣٢]

---

٣١ - رواه مسلم .

٣٢ - رواه مسلم .

**واته : هیچ كەســێك نییە زەكاتی پارە و ســامانی نەدا ئیلا لە ڕۆژی دوایدا لەناو ئاگری جەهەنم مارێك پێی دەئاڵێت ناوی ( شوجاعە ) ، و بە ئاڵتوون و ســامانەكەی نێو چــاوانی و تەنیشــتەكانی و پشــتی پێ داخ دەكرێت لە ڕۆژێكدا كە ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە ، بەم شێوەیە سزا دەدرێت هەتا قەزاوەت دەكرێت لە نێوان خەڵكدا .**

**❖ چـــل و دوو : خەو دروست كردن بە درۆوە :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن تَحَلَّمَ بحُلْمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أنْ يَعْقِدَ بيْنَ شَعِيرَتَيْنِ و لَنْ يفعَل ) [٣٣]

**واتە : هەركەســێك خەوێك بگێڕێتەوە و بە درۆوە خەوێك دروســت بكات لەكاتێك ئەو خەوەی نەیبینیوە لە ڕاســتیدا ئەوا لە ڕۆژی دوایدا فەرمانی پێ دەكرێت دوو دەنكە جـۆ بەیەكەوە گرێ بدات ، و هەرگیز ئەو كارەشی پێ ناكرێت .**

---

٣٣ - رواه مسلم .

❖ **چـــل و سـێ : گوێگرتن له كەسانێك كه پێیان ناخۆشه گوێبیستی قسەكانیان بیت :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَنِ اسْــــتَمع إلى حَديثِ قَوْمٍ وهُمْ له كارِهُونَ ، صُـــبَّ في أُذُنِهِ الآنُكُ يَومَ القِيامَةِ )[٣٤]

**واته : هەر كەســـێك گوێ بۆ قســەی كەســـانێك ڕابگرێت كه پێیان ناخۆشه گوێ بیستیان بێت ، ئەوا له ڕۆژی دوایدا مسی تواوه دەكرێته ناو گوێكانیەوه .**

❖ **چـــل و چوار : وێنەكێشان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّ أشَدَّ النَّاسِ عَذابًا عِنْدَ اللَّهِ يَومَ القِيامَةِ المُصَوِّرُونَ )[٣٥]

**واته : بەڕاستی به ئێشترین سزا له ڕۆژی دوایی بۆ ئەو كەسانەیه كه وێنەدەكێشن .**

---

٣٤ - رواه مسلم .
٣٥ - رواه مسلم .

**❖ چـــل و پێنج و چل و شەش : مارەبەجاش کردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لعَنَ اللهُ المُحَلِّلَ والمُحَلَّلَ له )[٣٦]

**واتە : خوای پەروەردگار نەفرەتی کردووە لەو کەســەی ژن و مێردێك دوای ســێ تەڵاقە بۆ یەك حەڵاڵ دەکات و نەفرەتی کردووە لەو کەسەش کە بۆی دەکرێت .**

**❖ چـــل و حەوت : نەفەقەت نەکێشان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( كفى بالمرءِ إثمًا أن يضيعَ من يقوتُ )[٣٧]

**واتە : هێندە تاوان بەسە لەسەر کەسێك بنوسرێت کە نەفەقەتی ئەو کەسانە پێ شێل ئەکەن کە واجبە لەسەریان نەفەقەتیان بکێشن .**

---

٣٦ - رواه أبو داود وصححه الألباني .

٣٧ - رواه مسلم .

❖ **چـــل و هەشت : ڕەشوەخواردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لعَن اللهُ الرَّاشيَ والمُرتشيَ )[٣٨]

**واتە : نەفرەتی خوای گەورە لە ڕەشوەدەر و ڕەشوەخۆر .**

❖ **چـــل و نـۆ و پەنــجا : تانەدان لە ڕەچەڵەك و خۆڕنین لە بۆ مردوو :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( اثْنَتانِ في النَّاسِ هُما بِهِمْ كُفْرٌ : الطَّعْنُ في النَّسَبِ و النِّياحَةُ علَى المَيِّتِ )[٣٩]

**واتە : دوو خەســـڵەت لە نێو خەڵكدا هەیە لە ســـیفاتی جاهلی بێ باوڕانن : تانەدان لە هۆز و ڕەچەڵەك ، و خۆڕنین لە بۆ مردوو .**

---

٣٨ - رواه أبو داود .

٣٩ - رواه مسلم .

❖ **پەنجا و یەک : دەرچوون لە جەماعەتی موسڵمانان :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن خَرَجَ من الجماعَةِ قِيدَ شِبْرٍ ، فقد خَلَعَ رِبْقَةَ الإسلامِ مِن عُنُقِه )[٤٠]

**واتە : هەرکەسێك بە ئەندازەی بستێك لە جەماعەتی موسڵمانان دەربچێت ئەوا پەتی ئیسلامی لە گەردنی کردووەتەوە .**

❖ **پەنجا و دوو : مەی و قومارکردن :**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ ﴾ ( البقرة / ٢١٩ )

**واتە : ئەی محمد ( صلی الله علیه وسلم ) پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی مەی و قومار تۆش پێیان بڵێ : ئەم کردەوانە خراپن و لە تاوانە گەورەکانن.**

٤٠ - رواه أبو داودو صححه الألباني .

❖ **پەنجا و سـێ : جوێندان وکوشتن به ناحەق :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( سِبابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ ، وقِتالُهُ كُفْرٌ )[٤١]

**واته : جوێندان به موسـلمان فاسـقێتییه ( واته دەرچـوونه له گوێڕایەڵی خودا ) و کوشتار کردن لەگەڵی کوفره .**

❖ **پەنجا و چوار : درۆکردن بەدەم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتعَمِّدًا ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ )[٤٢]

**واته : هەرکەسـێك درۆ بەدەم منەوە بکات ئەوا با جێگەیەك له ئاگری جەهەنەم بۆ خۆی خۆش بکات .**

---

٤١ - رواه البخاري .
٤٢ - رواه البخاري .

### ❖ پەنجا و پێنج : دزیکردن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ ، يَسْرِقُ البَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ ، وَيَسْرِقُ الحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ )[٤٣]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو دزەی ، کە هێلکەیەك دەدزێت دەبێتە مایەی دزینی دەستی ، یان پەتێك دەدزێت بەوهۆیەوە دەستی دەبڕدرێت .**

### ❖ پەنجا و شەش : دانانی شتێکی ڕوحدار بۆ نیشان شکێن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لعَنَ الله مَنِ اتَّخَذَ شيئًا فيه الرُّوحُ غَرَضًا )[٤٤]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی شتێك دەکات بە نیشان شکێن کە ڕوحدارە .**

---

٤٣ - رواه مسلم .

٤٤ - رواه مسلم .

❖ پەنجا و حەوت : داڵدەدانی بكوژ :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ مَن آوَى مُحْدِثًا )[٤٥]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی كردووە لەو كەسـەی داڵدەی بكوژێك دەدات .**

❖ پەنجا و هەشت : سەربڕینی ئاژەڵ لەبەر غەیری خودا :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ مَن ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ )[٤٦]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی كردووە لەو كەسـەی ئاژەڵێك بۆ غەیری خودا سەردەبڕێت .**

---

٤٥ - رواه مسلم .

٤٦ - رواه مسلم .

❖ **پەنجا و نـۆ و شەست : خۆدانەپاڵی جگە لە باوکی ڕاستی خۆت :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( من ادَّعى إلى غيرِ أبيه ، فعليه لعنةُ اللهِ والملائكةِ والنَّاسِ أجمعينَ )[٤٧]

**واتە : هەر کەسێك خۆی بداتە پاڵ کەسێك لە غەیری باوکی خۆی ( واتە کەسێکی تر بە باوکی خۆی بزانێت و پشت لە باەکە ڕاستەکەی خۆی بکات ) ، ئەوا نەفرەتی خودا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت .**

❖ **شەســت و یەك : داخ کردنی ڕومەت :**

عبدالله کوڕی مسعود (رضي الله عنه) فەرموویەتی :

( أنَّ النَّبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ مَرَّ عليه حِمَارٌ قدْ وُسِمَ في وَجْهِهِ، فَقالَ: لَعَنَ اللَّهُ الَّذي وَسَمَهُ )[٤٨]

**واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارێکیان بەلای گوێدرێژێکەوە ڕۆشت بینی ڕوومەتی داخ کرابوو ، فەرمووی : نەفرەتی خودا لەسەر ئەو کەسەی کە داخی ئەم گوێدرێژەی کردووە .**

---

٤٧ - رواه البخاري .

٤٨ - رواه مسلم .

❖ **شەست و دوو : دەستکاری کردنی سنوری زەوییەکان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ مَن غَيَّرَ مَنَارَ الأَرْضِ )[٤٩]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو کەسەی بەینی زەوییە کشتوکاڵەکان دەستکاری دەکات و زەوی بۆ خۆی زەوت دەکات .**

❖ **شەست و سێ : غەیبەت کردن :**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا ﴾ ( الحجرات / ١٢ )

**واتە : با کەستان غەیبەتی یەکتری نەکەن ، ئایە هیچ کەسێکتان پێتان خۆشە گۆشتی برای خۆی بە مردووی بخوات ؟! .**

---

٤٩ -رواه مسلم .

## ❖ شەست و چوار:ئەوانەی بەهۆی مەیەوە نەفرەتییان لیٚ دەكریٚت:

پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚت :

( لعن اللهُ الخمرَ ، وشارِبَها ، وساقِيَها ، وبائِعَها ، و مُبْتَاعَهَا ، وعاصرَهَا ، ومُعْتَصِرَها ، وحامِلَها ، و المحمولَةَ إليهِ ، وآكِلَ ثَمَنِها )[٥٠]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی كردووە لە مەی و لەوەش كە دەیخواتەوە و لەوەش كە بۆ خەڵكی تیای دەكات و لەوەش دەیفرۆشـــیٚت و لەوەش كە دەیكرِیٚت ولەوەش كە میوەكە دەگوشـــیٚت بۆ ئەوەی بكریٚتە مەی و لەوەش كە بۆی دەگوشـــریٚت و لەوەش كە مەیەكە بار دەكات و هەڵی دەگریٚت و لەوەش  كە بارەكەی بۆ دیٚت و بۆی هەڵدەگرن و نەفرەت لەوەی پارەی مەی دەخوات.**

## ❖ شەست و پیٚنج : تاتــۆكردن :

پیٚغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚت :

( لَعَنَ اللَّهُ الواشِماتِ والمُسْتَوْشِماتِ )[٥١]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەی كە تاتۆ بۆ خەڵك دەكەن و نەفرەتی كردووە لەو ئافرەتانەش كە تاتۆیان بۆ دەكریٚت .**

---

٥٠ - رواه أبو داود وصححه الألباني .

٥١ - رواه البخاري .

❖ **شەست و شەش شەست و حەوت : برۆهەڵکردن و ددان شاش کردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

(لعَنَ اللَّهُ النامصات والمُتَنَمِّصاتِ والمُتَفَلِّجاتِ لِلْحُسْنِ، المُغَيِّراتِ خَلْقَ اللَّهِ)[٥٢]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی برۆ هەڵدەکەن و نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەش کە بۆیان هەڵدەکەن و نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە بەینی ددانەکانیان شـــاش دەکەن لەبۆ جوانی ، ئەفەرموێ ئەمانە خەڵقی خودا دەگۆڕن و دەستکاری دەکەن .**

❖ **شەست و هەشت : گەیاندنی قژی باڕووکە بە قژی ڕاستی :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ الواصِلَةَ والمُسْتَوْصِلَةَ )[٥٣]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە قژی سەناعی دەبەستنەوە بە قژی ڕاستی خۆیان .**

---

٥٢ - رواه البخاري .
٥٣ - رواه البخاري .

### ❖ شەسـت و نـۆ : خۆشوبهاندنی پیاوان بە ئافرەتان و خۆشوبهاندنی ئافرەتان بە پیاوان :

عبداللە کوڕی عباس (رضي الله عنهما) فەرموویەتی :

( لَعَنَ رَسـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللهُ عليه وسـلَّمَ المُتَشَـبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بالنِّسَـاءِ، والمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بالرِّجَالِ )[٥٤]

**واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی کە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان ، و نەفرەتیشی کردووە لەو ئافرەتانە کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان .**

### ❖ حەفـتا : دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕێك :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( لَعَنَ اللَّهُ اليَهُودَ والنَّصارَى ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أنْبِيائِهِمْ مَسْجِدًا )[٥٥]

**واتە : خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە جولەکە و گاور ، بەهۆی ئەوەی گۆڕی پێغەمبرانیان کردبوو بە مزگەوت .**

---

٥٤ - رواه البخاري .

٥٥ - رواه البخاري .

❖ **حەفـــــتا و یەك و حەفتا و دوو و حەفتا و ســێ : گرتنەوەی ئاو لە ڕێبوار و کڕینی شمەك بە سوێندی درۆ وخیانەت کردن لە کاربەدەست :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( ثلاثةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ يومَ القيامةِ، ولا ينظرُ إليهم، ولا يزكِّيهم، ولَهُم عذابٌ أليمٌ: رجلٌ على فَضلِ ماءٍ بالفلاةِ يمنعُهُ ابنَ السَّبيلِ، ورجلٌ بايعَ رجلًا سِلعةً بعدَ العصرِ فحَلفَ باللَّهِ لأَخذَها بِكَذا وَكَذا فصدَّقَهُ، وَهوَ عَلى غيرِ ذلِكَ، ورجلٌ بايعَ إمامًا لا يبايعُهُ إلَّا لدُنْيا، فإن أَعطاهُ مِنها وفى لَهُ، وإن لم يعطِهِ منها لَم يفِ لَهُ)[٥٦]

**واتە : سێ کەس لە ڕۆژی دوایدا خوای پەروەردگار قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و لە تاوانەکانیشیان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بە ئێشیشی بۆیان دانیاوە ئەوانەش بریتین لە :**

**پیاوێك لە دەشتێکی چۆڵدا ئاوی زیادەی پێیە و لە ڕێبوارێك قەدەغەی دەکات و بێ بەشی دەکات ،**

**وپیاوێك شمەکێك لە دوای عەسر دەفرۆشێت بە کەسێك و سوێندی لەسەر دەخوات کە بەمەندە و بە مەندە کریویەتی بەهۆی سوێندەکەی بسێن باوەڕی پێ دەکات لە کاتێك بەو شێوەش نەبووە ! ،**

**و پیاوێك بەڵێنی گوێڕایەڵی بە کاربەدەستێك دەدات تەنها لەبەر مەبەستی دونیا جا ئەگەر ئەو کاربەدەستە لە ماڵی دونیا بداتێ بە وەفا دەبێت لەگەڵی و ئەگەر لێی ببڕێت سفڵەیی دەنوێنێت لەگەڵی .**

---

٥٦ - رواه مسلم .

### ❖ حەفـتا و چوار : شەڕواڵ شۆڕکردن بەمەبەستی کیبر :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاءَ، لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يومَ القِيامَةِ )[٥٧]

**واته : هەرکەسێك شەرواڵەکەی شۆڕ بکاتەوە بەمەستی فیز و خۆبەزل زانین خوای گەورە لە ڕۆژی دوایدا تەماشای ناکات .**

### ❖ حەفـتا و پێنج : ڕۆژو نەگرتنی مانگی ڕەمەزان :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن أفطَرَ يَومًا في رمضانَ مِن غَيرِ رُخصةٍ رَخَّصَها اللهُ؛ لم يَقضِ عنه صيامُ الدَّهرِ )[٥٨]

**واته : هەرکەسێك ڕۆژویەك لە ڕەمەزان بە بێ عوزرێك کە خوای گەورە دایناوە نەیگرێت ئەوا هەموو ساڵەکە بگرێتەوە ئەو ڕۆژووە قەرەبوو ناکاتەوە و جێگەی ناگرێتەوە .**

---

٥٧ - رواه البخاري .

٥٨ - رواه الترمذي و أبو داود و ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب و الترهيب برقم ٥٢٨ .

**❖ حەفـتا و شەش : هەڵگرتنی چەك لەبەرامبەر برای موسڵمان :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن حَمَلَ علَيْنا السِّلاحَ فليسَ مِنَّا )[٥٩]

**واتە : هەرکەسێك چەکمان لە بەرامبەردا هەڵبگرێت ئەوا لە ئێمە نییە .**

**❖ حەفـتا و حەوت : بەجێ نەهێنانی پایەیەك لە پایەکانی ئیسلام :**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( بُنِيَ الإسْـلَامُ علَى خَمْسٍ : شَـهَادَةِ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ مُحَمَّدًا رَسـولُ اللَّهِ، وإقَامِ الصَّلَاةِ، وإيتَاءِ الزَّكَاةِ، والحَجِّ، وصَوْمِ رَمَضَانَ )[٦٠]

**واتە : ئیسـلام لەسـەر پێنج پایە بنیادنراوە :شـایەتی دات لەسـەر ئەوەی هیچ خودایەك نییە بەحەق شـایەنی پەرسـتن بێت تەنها زاتی الله نەبێت و شـایەتی دان بەوەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پەیامبەری خودایە، و نوێژکردن و زەکاتدان و حەجکردن و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان .**

---

٥٩ - رواه البخاري و مسلم .

٦٠ - رواه البخاري و مسلم .

**❖ حەفـتا و هەشت : دزینی و ناپاكی لە سامانی گشتی :**

أبـو هـریره (رضي الله عنه) فەرموویەتی :

( قَامَ فِينَا النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ، فَذَكَرَ الغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وعَظَّمَ أمْرَهُ )[٦١]

**واتە : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارێكیان لەناومان هەستا و باسی ( غلول ) بۆ كردین** ( واتە دزین و خیانەت كردن لە سامانانی بە جێماوە لە جەنگ ) **زۆر بە تاوانێكی گەورە باسـی دەكرد و ئەم باسـەی بە گەورە دادەنا .**

**❖ حەفـتا و نـۆ : جووت بوون لە كۆمی ئافرەت :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( ملعونٌ مَن أتى امرأتَهُ في دُبُرِها )[٦٢]

**واتە : ئەو كەسـەی لە كۆمی خێزانییەكەیەوە جووت دەبێت نەفرەت لێ كراوە .**

---

٦١ - رواه مسلم .

٦٢ - رواه أبو داود وصححه الألباني .

❖ هەشــتا : ستەمکردن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( اتَّقُوا الظُّلْمَ، فإنَّ الظُّلْمَ ظُلُماتٌ يَومَ القِيامَةِ )[٦٣]

**واته : خۆتان لە ستەم کردن بپارێزن چونکە ستەم لە ڕۆژی دوایی تاریکییە بۆ خاوەنەکەی .**

❖ هەشــتا و یەك : ئاسن هەڵگرتن لە دژ برایەکی موسڵمانت :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن أشــارَ إلى أخِيهِ بحَدِيدَةٍ ، فإنَّ المَلائِكَةَ تَلْعَنُهُ، حتَّى يَدَعَهُ، وإنْ كانَ أخاهُ لأَبِيهِ وأُمِّهِ )[٦٤]

**واته : هەرکەسـێك بە ئاسـنێك ئاماژەیەك بۆ برایەکی موسـڵمانی بکات ، لەو ســاتەدا فریشــتەکان نەفرەتی لێدەکەن هەتا فرێی دەدا ، ئەگەر ئەو برایە برای دایك و باوکیشی بێت .**

---

٦٣ - رواه البخاري و مسلم .

٦٤ - رواه مسلم .

❖ **هەشـــتا و دوو : ئاسن هەڵگرتن لە دژ برایەکی موسڵمان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( أَبْغَضُ الناسِ إلى اللهِ مُلْحِدٌ في الحرمِ )[٦٥]

**واتە : خراپترینی خەڵك بەلای خوداوە بریتییە لەو کەســەی تاوان دەکات لە حەرەمی مەکە یا مەدینە .**

❖ **هەشـــتا و سێ : فێڵ کردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن غَشَّنا فليسَ مِنَّا )[٦٦]

**واتە : هەر کەسێك فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نییە .**

---

٦٥ - رواه البخاري .

٦٦ - رواه مسلم .

### ❖ هەشـــتا و چوار : ڕوپامایی کردن :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن يُسَمِّعْ يُسَمِّعِ اللَّهُ به، ومَن يُرائِي يُرائِي اللَّهُ بِهِ )[٦٧]

**واتە : هەرکەسـێك عەیبە و کەموکوڕی خەڵك بدات بە گوێی خەڵكدا و ئاشـکرای بکات ئەوا خوای گەورە عەیبەی دەدات بە گوێی خەڵكدا و ئاوڕوی دەبات ، و هەرکەسێك کردەوە بۆ ڕییایی بکات ئەوا خوای گەورە کردەوەکەی پیشان خەڵك دەدات و پاداشت و خێری ئەو کردەوەیەی لێ قەدەغە دەکات.**

### ❖ هەشـــتا و پێنج : ڕۆشتنە لای جادوباز :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن أتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عن شيءٍ، لَمْ تُقْبَلْ له صَلاةٌ أرْبَعِينَ لَيْلَةً )[٦٨]

**واتە : بڕواتە لای جادوبازێك و پرسـیارێکی لێ بکات** ( واتە پرسـیارێکی لێ بکات لە بارەی غەیبەوە بۆ نمونە بڵێت : ئایە من قســـمەت گیراوە ؟ یان ئایە ئەو کچـــە دەبێت بە نســـیبم ؟ یان ئایە دەکرێت کور و کچـــێك بەیەك بگەیەنیت ؟ ئەمانە و لەم چەشنە پرسیارانە تەنها بەوەی بڕۆیتە لای جادوبازەکە و یەك پرسیاری لێ بکەیت چل ڕۆژ نوێژت قبوڵ نابێت )[٦٩] **خوای گەورە چل شەو نوێژی قبول ناکات .**

---

٦٧ - رواه البخاري .

٦٨ - رواه مسلم .

٦٩ - **( وەرگێڕ )**

❖ **هەشـــتا و شەش : خواردن و خواردنەوە لە قاپی ئاڵتون و زیو :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّ الذي يَأكُل أو يَشــرَب في إناءٍ من ذهبٍ أو فضــةٍ، فإنما يُجَرْجِرُ في بطنه نارًا مِن جهنَّم )[٧٠]

**واتە : هەرکەســـێك لە قاپ و قاچـــاخی ئاڵتون یان زیو خواردن و خواردنەوە بخواتەوە ئەوا لە ڕۆژی دوایدا ئاوێك لە ئاگری جەهەنەمی پێ دەدرێت لەناو سکیدا هەڵدەقوڵێت .**

❖ **هەشـــتا و حەوت : پۆشینی ئاورێشم بۆ پیاوان :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّما يَلْبَسُ الحريرَ مَنْ لا خَلاقَ لَهُ )[٧١]

**واتە : ئەو پیاوەی ئاورێشـــم دەپۆشـــێت لە قیامەتدا هیچ بەشـــێکی نییە لە خێر .**

---

٧٠ - رواه مسلم .

٧١ - رواه البخاري .

❖ هەشـــتا و هەشت : جویندان بە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویت :

( لا تَسُبُّوا أصْحابِي ، فلوْ أنَّ أحَدَكُمْ أنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، ما بَلَغَ مُدَّ أحَدِهِمْ ولا نَصِيفَهُ )(٧٢)

**واتە : جوێن بە هاوەڵانم مەدەن ، ئەگەر کەسێك لە ئێوە بە ئەندازەی شاخی ئوحود ئاڵتوون ببەخشێت ناگات بە بەخشینی مشتێك لە بەخشینی هاوەڵانم تەنانەت ناگات بە نیو مشتیش .**

❖ هەشـــتا و نـۆ : پۆشینی ئاورێشم بۆ پیاوان :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویت :

( لو يَعْلَمُ المَارُّ بيْنَ يَدَيِ المُصَلِّي مَاذَا عليه، لَكانَ أنْ يَقِفَ أرْبَعِينَ خَيْرًا له مِن أنْ يَمُرَّ بيْنَ يَدَيْهِ )(٧٣)

**واتە : ئەگەر ئەو کەســەی کە پێش نوێژخوێنێك دەڕوات بزانێت ئەم کارەیە چەند تاوانێکی گەورەیە ئەوا لە ڕۆژی دوایی ئاواتەخوازە چل بوەستایە بەس بە پێش ئەو نوێژخوینەدا نەڕۆشتایە . ( ڕاوی فەرموودەکە گومانی بۆ دروست بووە نازانێت ئەو ڕاوەستانە ئایە چل ساڵە یان چل مانگە یان چل ڕۆژ ، بەهەر حاڵ دیاری نەکراوە بەڵام هەر کامەیان بێت ئەم وتەیە بۆیە وتراوە بۆئەوەی گەورەیی تاوانەکە دەربخات )(٧٤)**

---

٧٢ - رواه البخاري .

٧٣ - رواه البخاري ومسلم .

٧٤ - **( وەرگێڕ )**

### ❖ نەوەت : سەرپێچیکردنی کۆیلە لە سەر گەورەکەی :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( أَيُّما عَبْدٍ أَبَقَ مِن مَوَالِيهِ فقَدْ كَفَرَ حتَّى يَرْجِعَ إِلَيْهِمْ )[٧٥]

**واتە : هەر کۆیلەیەك لە سەیدەکەی هەڵبگەڕێتەوە و سەرپێچی بکات ئەوا لەتاوانەدایە هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لای سەیدەکەی و پەشیمان دەبێتەوە .**

### ❖ نەوەت و یەك : بانگەشە کردن بۆ خراپە :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( مَن دَعا إلى ضَلالَةٍ ، كانَ عليه مِنَ الإثْمِ مِثْلُ آثامِ مَن تَبِعَهُ ، لا يَنْقُصُ ذلكَ مِن آثامِهِمْ شيئًا )[٧٦]

**واتە : هەر کەسێك بانگەشە بکات بۆ خراپەیەك ئەوا تاوانی هەموو ئەوانە هەڵدەگرێت کە شوێنی کەوتوون و لە تاوانی هیچ کامیان کەم نابێتەوە . ( واتە هەردووکیان تاوانیان دەگات بەڵام ئەوەی بانگەشەکار بووە بۆ خراپە دووجار تاوانی دەگاتێ تاوانی خۆی و تاوانی شوێنکەوتووانی )[٧٧]**

---

٧٥ - رواه مسلم .

٧٦ - رواه مسلم .

٧٧ - ( وەرگێڕ )

**❖ نەوەت و دوو : باس و وەسف کردنی سەرجێی کردنی ژن و مێرد له لای خەڵکی :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّ مِن أَشَـــرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يومَ القِيَامَةِ، الرَّجُلَ يُفْضِـــي إلى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيْهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا )[٧٨]

**واتە : خراپترین مەنزلگا لە ڕۆژی دوای لە لای خوای گەورە بۆ ئەو کەســەیە کە ســەرجێی لەگەڵ خێزانی دەکات پاشــان لە لای خەڵکیدا باسی دەکات و نهێنی سەرجێییەکەی وەسف دەکات و دەی درکێنێت .**

**❖ نەوەت و سێ و نەوت و چوار : کوشتار کردن لە حەرەمی مەدینە و داڵدەدانی بکوژ تیایدا :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( المدينةُ حرامٌ من كذا إلى كذا ، لا يُقطَعُ شـــجرُها ، ولا يُحدَثُ فيها حدثٌ ، من أحدث فيها حدثًا ، أو آوى محدِثًا ، فعليه لعنةُ اللهِ ، والملائكةِ ، والناسِ أجمعين ، لا يَقبلُ اللهُ منه يومَ القيامةِ صرفًا ، ولا عدلًا )[٧٩]

---

٧٨ - رواه مسلم .
٧٩ - رواه البخاري .

**واتە : شاری مەدینە حەرام کراوە لە ئێرەوە بۆ ئێرە ، لەم نێوانەدا نابێت دارەکانی ببڕدرێت و نابێت کوشـــتاری تێدا بکرێت یان داڵدەی بکوژی تیا بدرێ جا هەرکەســـێك لە حەرەمی مەدینەدا وا بکات ئەوا نەفرەتی خودا و فریشـتەکان و هەموو خەڵکی لەسـەر بێت ، و خودای گەورە لە ڕۆژی دوایدا پەرستشی فەرز و سونەتی لێوەرناگرێت .**

❖ **نەوەت و پێنج : کوشـــتنی بێ باوەڕێك کە ئەمانەتدراوە لە لایەن موسڵمانێك:**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( من أخفر مسلمًا فعليه لعنةُ اللهِ والملائكةِ والناسِ أجمعين لا يقبلُ اللهُ منه يوم القيامةِ صرفًا ولا عدلًا )[٨٠]

**واتە : هەرکەســـێك ئەمانەتدراوێکی موســـڵمانێك بکوژێت ئەوا نەفرەتی خودا و فریشـتەکان و هەموو خەڵکی لەسـەر بێت ، و خودای گەورە لە ڕۆژی دوایدا پەرستشی فەرز و سونەتی لێوەرناگرێت .**

---

٨٠ - رواه البخاري .

### ❖ نەوەت و شەش : وتنی خوای گەورە لە فڵان و فڵان خۆش نابێت :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( إنَّ اللَّهَ تَعالَى قالَ: مَن ذا الذي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أنْ لا أغْفِرَ لِفُلانٍ ، فإنِّي قدْ غَفَرْتُ لِفُلانٍ، وأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ )[٨١]

**واتە : خوای گەورە دەفەرموێت : ئەوە کێیە ســـوێن بەناوی منەوە دەخوات کە من لە فلان کەس خۆش نابم ، ئەوا بە دڵنیاییەوە من لەو کەســە خۆش دەبم و کردەوەی تۆش بەتاڵ دەکەمەوە . ( واتە کردەوەی ئەو کەسەی سوێد دەخوات بەناوی خودا کە خودا لە فلأن و فلأن خۆش نابێت )**

### ❖ نەوەت و حەوت : وازهێنان لە نوێژی هەینی :

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :

( لَيَنْتَهِينَّ أقْوامٌ عن ودْعِهِمُ الجُمُعاتِ ، أوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ علَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكونُنَّ مِنَ الغافِلِينَ )[٨٢]

**واتە : کەسانێك کە وازیان هێناوە لە ڕۆشتن بۆ نوێژی هەینی یان دەبێ دەست لە تاوانە هەڵبگرن یان خوای پەروەردگار مۆر لە دڵیان دەدا و پاشان دەبنە یەکێك لە بێ ئاگایان .**

---

٨١ - رواه مسلم .
٨٢ - رواه مسلم .

❖ **نەوەت و هەشت : گوێڕایەڵی نەکردنی پیاو بۆ سەرجێی کردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إلى فِرَاشِـهِ فأبَتْ فَبَاتَ غَضْـبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا المَلَائِكَةُ حتَّى تُصْبِحَ )(٨٣)

**واتە : ئەگەر پیاوێك بانگی خێزانی بکات لە بۆ ئەوەی سـەرجێی لەگەڵ بکـات و خێزانی ڕەتی بکـاتـەوە و پیـاوەکـەی بنوێـت بـە تورەییـەوە ئـەوا فریشتەکان نەفرەت دەکەن لە ئافرەتە هەتا بیانی دەکاتەوە .**

❖ **نەوەت و نۆ و سەد : نەفرەت کردن و سفڵەیی کردن :**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت :

( تَصَدَّقْنَ؛ فإنِّي رَأَيْتُكُنَّ أكْثَرَ أهْلِ النَّارِ. فَقُلْنَ: وبِمَ ذلكَ يا رَسولَ اللَّهِ؟ قَالَ: تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وتَكْفُرْنَ العَشِيرَ )(٨٤)

**واتە : ئەی ئافرەتان خێر ببەخشـن ، چـونکە زۆربەی ئەهلی دۆزەخم بینیوە لە ئافرەتانە ، ئافرەتەکان فەرموویان : بۆچـی زۆربەمان ئەهلی دۆزەخین ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ؟ ئەویش فەرمووی : چـونکە نـەفرەت زۆر دەکـەن و سـفلـەیی زۆر دەنوێنن بـەرامبـەر بـە مێردەکانتان .**

---

٨٣ - رواه مسلم .

٨٤ - رواه البخاري .

# فەهرەستی فەرموودەكان

## ناونیشانی فەرموودەكان --------- ژمارەی لاپەڕەكان

******

# زیانەکانی تاوان

- نیعمەتەکانی خودا کەم دەکاتەوە
- شەرم و حەیا لەخاوەنەکەی دەسێنن
- خەم و خفەت و قەلەقی بەجێ دەهێڵێت
- عیبادەت کردنت لەسەر قورس دەکات
- بەرەکەتی خودات لەسەر ناهێڵێت
- مـردن و قیامـەتت لەیاد دەکات
- دەتکات بە کۆیلەی شەیتانەکان
- هۆکاری دابەزینی موسیبەتەکانە
- خودات لەبیر دەکات ، خوداش لەبیرت دەکات




چاپی یەکەم - 1444 هـ